# بەرسیلە عیشقیٚ بۆ خودا

## شیعر

ئاوێزان نوری

2005

بەرسیلە عیشقیٚ بۆ خودا


- ناوی کتێب: بەرسیلە عیشقیٚ بۆ خودا
- بابەت: شیعر
- نووسەر: ئاوێزان نوری
- لە بڵاوکراوەکانی لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد 38
- نەخشەسازیو بەرگ: عومەر سەیدە
- ساڵی چاپ: 2005

بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

**بە**

**ـ خودا .. کە بە بێ ئاگایی خۆم هاتووەتە نێو یەکە یەکەی شیعرەکانم**

**ـ دووبارە بە عیشق**

**ـ نەورۆز .. کە پیرۆزیی دایکایەتی پێ بەخشیم**

**ـ بە تۆ .. گەر توانیت بمخوێنیتەوە**

## پێشکەشە:

## لەحزوری گومانتدا.. زریکە لە ئەوینم هات

نامۆ مەبە بە جوداییم
ئەوە من نیم کە تۆراوم
بەڵکو فرمێسکی قەڵەمێکی نەفامە
نەفام بەوەی..
دڵۆپ.. دڵۆپ ئەشکی دەکردە پیتو..
پیت بە پیت وشەی دەکردە گوڵو ..
وشە.. وشە گوڵی دەکردە رستەو..
رستەشی دەدایە دەستی شاعیرێك
تا وەرزێك لەگوڵ بۆت بکا بە هۆنراوەو..
بەدەستی شەماڵ بتداتێ
داخەکەم.. کە بووی بە وەرزی خەزانو..
پەڕ.. پەڕ هەڵت وەشاندەوە
من کاڵفامم..
ئەوە من نیم پەشۆکاوم





بەڵکو رەنگ زەردی دار (بی)یەکی کەنار دەریای ئەوینە
کاتێ سوژدەی بۆ شەپۆل برد
تا لە تورڕەبوونت بگا
بە شۆڕەبی بانگیان کردو..
سۆز بوو بە قەترەیەك ئاوو..
بەتەوێڵی گەڵاکانیدا..
کەوتە سەر ئێسقانی ئەو ماسیە حەزەی
کاتێ ویستی لەناختدا مەلە بکا
تا لەگەڵ هەناسەداندا..
نهێنیەکانی قوڵی دەروونت ئاشکرا بکا
بەشەپۆلێك هەڵتدایە نێو تۆڕی خەم گرێكو..
دەرخواردی پشیلەکانی گومانت دا
بۆیە دەڵێم لێت نابورمو..
ئەمێستا بۆ جارێکی دی لە حزوری گەمژەییمدا
وردە.. وردە تەنیایی دەگرمە باوەش

تۆش بە نیگا پێم دەڵێی پەشیمانم

لەدوای ئەوەی..

نەتتوانی.. ساتێ لەگەڵ هەوری رقت

بارانی سۆز بیارێنیێو..

خەونە پەمەییەکانی.. سنەوبەری ئەوینم تەفسیر بکەی

نەتتوانی..

گوێ لە چیرۆکی هەرزەکاریم رابگریو..

چاوێک بەدەفتەری حەسرەتەکانم بخشێنی

کەمن بۆت تەنها خاکێک بووم

دەتتوانی زۆر بەئاسانی

نەخشەی ولاتێک بکێشی

پڕی بێ لە ویستەکانتو..

بۆ دەردو مەینەتەکانت سنوردار بێ

بەڵکو تاقە پەنجەرەیەک بووم

دەتتوانی زۆر بەئازادی

لەمنەوە.. نیگا لە شەقەی باڵبدەی





تا روانینە رەنگاڵیەکانت

پرچی ئایشەو فاتمەی پێ بهۆننەوە

کوڕی شەقام

لەدووریانی گومانەکان لەیادم کەو..

چاو مەبڕە شەقامە چۆڵەکانی دڵنیایی

جارێکی دی نابمەوە بە کچی شۆستەو..

رێبوارانت بمکەنەوە شوێن پێی خۆیان

نا.. ئەیکوڕی قەڵەم

چیدی نابمەوە بە خەندەی لێوی شیعرو..

وشەکانت بێن چاوم لێ زیت بکەنەوە

نا.. نابمەوە بەوەی بۆت بووم

2005/2/23

## بەرلەوەی سنور بشکێنم.. درزم تێکەوت

ئەمشەو..

ویستم ئاودیوی سنوربم

تا بچمە نێو پادشای حەزمو..

تاجی زێڕینی  بدزم

ئەمشەو.. ویستم

بەدەستی تریفەیەکی شەرمن..

دوگمەی کراسەکەم یەک.. یەک

بترازێنم

بە باڵێک بفڕم

(هیچ قەقنەسێک پێی نەفڕیبێ)

بەگڤەو.. سەمفۆنیای (با)یەک

چی درەختو گەڵا هەیە..

بەگۆرانیو سەما بێنم

ئەمشەو ویستم





گوێ بۆ دەنگی..

جریوە جریوی ئەستێرەکان هەڵخەم

زەمەنێکە دەیانەوێ لەشەوێکدا..

رازو نیازی خۆیانم بۆ بچڕن

هەندێک لە بەدبەختی خۆیان بدوێنو..

کە کەسێک نەبوو ناویان لێنێ

تا بۆ جارێکیش گوێیان بزرینگێتەوەو..

بە ناوی خۆیان بانگ بکرێن

هەندێکیشیان نێو لەپی یەکدی  بخوێننەوە

تا بزانن کامیان زوتر خۆیان مارە دەکەن لەمانگ

لای هەندێکیشیان باس باسی دووعاشق بوو

کەناویان (لەیلو مجنون)ەو..

ساڵی دووجار شان لەشانی یەکدی دەدەن

دەڵێن گوایە لەو دووجارەش

دونیا دەبێ بە تەمو مژ

کەس ناتوانیٚ بیانبینیٚ تاکو بلێن

خودایە مەرازمان بدەی

ئەمشەو ویستم

بە چەقۆی (جورئەت) سنگی شەرم..

شەق.. شەق بکەم

حەزەکان لەخەو هەڵسێنم

تا لە ژێر نەرمە نەرمی بارانی عیشق

لەگەڵ (یار)دا سەما بکەن

بەڵام ئەفسوس

لە چاو تروکانێکدا

خەمێك لەکاتژمێری دڵ تەوقیت کراو..

زەنگێك لێیداو دەنگێك گوتی

(سەندرێلا) بگەڕێوە

کاتت نەما

چ شەوێکی شوم بوو ئەمشەو فریشتەکەم

چەندت پێگوتم مەڕۆ هەر رۆیشتم





خۆزگە بەقسەم دەکردی

بەر لەوەی بەقسەی خۆم کەم

ئەوەتانیٚ

ویستەکانم بوون بە درۆو..

ئەوینیان بریندار کردو..

خۆزگەیان کوشت

واقە.. واقی.. بۆقەکانیش شاریان پڕکرد..

خودایە چیمان بەسەرهات

منو ژیان کەوتینە داوی نەزانین

تۆش جێتهێشتین

ئاورێکت لێنەداینەوە

چوون هاورێیەك بووی خودایە..؟

ئەوەتانیٚ..

پەتی سێدارەی مەرگیان بۆ (ژیان) هەڵواسیو..

(من)یش مەحکوم کرام بەخەم

لەبەر ئەوەی سپیترین گوناهم کرد

وەک سپێتی شیری دایکم

کەمنو براکەمی پێ گەورە کردو..

فێری کردین

هەموو شتێک لەو عادەت بێو لەمن عبرەت

بێ گوناهترین تاوانم کرد

وەک بەرائەتی پەپولە

هێندە ئەویینداری شەم بوو

ویستی وەک من لەشەوێکدا

لەگریانەکانی بگا

تا خۆی سوتان

ئەوەتانێ

سەرابێک لە منو خۆمدا

لەسەحرادا ونم دەکا

شەوێکیش بەزۆرە ملێ

تەوبەی هەزار شەوم پێدەکا

**سلێمانی** 2004/12/5





# تەنیایی لەمندا هەڵدەكا..!!

من پڕم لە ڕەنگەكەكانی تەنیایی.. ئەویش لەمن

گەلا.. گەلا.. تەنیاییم لێ هەڵدەوەرێ.. ئەویش من

شەوان لەنێو باخەڵی حەسرەتەكاندا

تەنیایی بەخۆمدا دەدەم

بەیانیانیش بەزەنگی (ئەو) بەئاگا دێمەوە

ئەو.. ئەوی ساقی

هەردەم لەسەر مێزی فیراق

تاڵیی شەرابی تەنیاییم پێ هەڵدەداو..

بەسەرخۆشی..

بەكۆڵانی تریفە كوژراوەكاندا

دەمنێرێتەوە بەر دەرگای..

ژورێك یاخی لەپەنجەرەو..

پەنجەرەیەك یاخی لەمیوانداریێتی مانگ‌و..

تەوقەكردن لەگەڵ ئەستێرەكاندا





بەسەرخۆشی..

دەمباتەوە بەر حاڵگرتنی ئەو دەفەی..

نێڵە نێڵێتی بەدەستی دەروێشێكی..

عاشق بە زیكرێكی سۆفیانەو..

تێكەڵ بوونێك لەگەڵ خودا

ئەوو..

ئەو سێبەرێكە

بەرۆح‌و جەستەمەوە لكاوەو..

بەتەك هەنگاوەكانمەوە..

پیاسەی تەنیاییم پێ دەكا

منی تەنیاو..

ئەویش لەكۆڕی ئەویندا..

بەنەغمەی حەسرەتێك

بەیاخی بوونی پەنجەكان

لەژەنینی كەمانچەی عاتیفە

شیعرو گۆرانی تەنیایی دەڵێتەوە
من تارماییو..
ئەویش لەنێو دەفتەری بیرەوەریەکانیدا
دەمخاتە نێو دێڕی ئەو برینانەی..
ساڵێ بەساڵێ.. فێری ژانەکانی تەنیایی دەکردنو..
ئەفسانە دەمنووسێتەوە
من درەختی زەمەنێکم.. تەنها تەنیایی دەگرم
ئەویش لە ژێر سێبەری گەڵا خوراوەکانی گومانم
پاڵدەکەوێو..
بە تەمەوە..
دەستی نیگا بە باڵا لاوازەکەمدا دەهێنێو..
بەقێزەوە دەم بۆ میوە گەییوەکانی قەدەم دەبا
من تەنیاو..
لەگەڵ تەنیایی سەفەردەکەم
ئەویش لەنێو هەناسەمدا گوزەر دەکا
من دەمەوێ خۆم لە تارمایی تەڵاق بدەم





ئەو دوبارە لەتەنیایی مارەم دەکاو..
گۆزەی سەرشانی قەدەرم..
لە ئاوی مەراق پڕ دەکات
بۆشاییەکانی ئەم ژیانە بەچی پڕ دەبنەوە
ئەگەر بەتەنیایی نەبێ..؟
لەقوتابخانەی نامۆیی..
چی بڵێمو.. بخوێنمەوە
گەر وانەی تەنیایی نەبێ..؟
لە حەزارەتی دەورانم.. کێ ببەمە عەرشی فەلەك
گەر خودای تەنیایی نەبێ..؟
لەسەدەی کڵۆڵیمدا
تەنیایی فرعەونێکە..
لەتابووتی جەستەمدا مۆمیا کراوە
لە ماڵی دۆزەخێکدا
تەنیایی ئاگرێکە
لەگوناهە بەربەریەکانم بەربووە

لەشارێکی نابەڵدا

تەنیایی میوانێکی زوگورتیە

لەسەر تەختی چارەنووسم.. نیشتەجێیە

خودا تەنیاو..

پایز تەنیاو..

گریانی پیاوێک لەولاتی غەریبی.. تەنیا

پێکەنینی ژنێک لەبەرامبەر ئاوێنەکەی تەنیا

زیندوویەک تەنیا دەمرێتو..

دەچێتە گۆڕێکی تاریکیش بەتەنیا

من تەنیاو..

لەگەڵ ئەویشدا هەر تەنیام

چ فەلسەفەیەکە تەنیایی

ئەو لەمندا

منیش لەئەو..

هەردووکمان لە بێکەسیدا هەڵدەکەین ..!!

کەرکوک2005/3/24

# من و تۆو .. ؟!

لە بناری بێ ئاگایی ئەویندا
حەیرانێکت بۆ چڕیم,
من‌و تۆو گەمژەیی
لەبەر کڕێوەی نەفامیدا..
رەق بوینەوە
من‌و تۆو هەڵە
لە تەوقەی یەك ناسیندا
عەورەتی مانگمان بڕیەو..
تریفەی ئەستێرەمان خەتەنە کرد
من‌و تۆو گوناە
لە تاوانکردنی دەربڕینی دوو وشە
فەرموودەکانی عیشقمان پەڕ پەڕ کردو..
قامکەکانی خۆشەویستیمان شکاند
من‌و تۆو رووتانەوە





بە پەنجە گرمژنەکانی وشکە (با)
تەڵە پرچەکانی پایزمان شانە کرد
من‌و تۆو نازانم
لە وەڵامدانەوەی پرسیارە نەزۆکەکان رامانکرد
من‌و تۆو درۆ
ئیمبراتۆریەتێکمان دامەزراندو..
سەری راستیەکانمان لە لەشیان جیاکردەوە
من‌و تۆو ناحاڵیبوون
لە سەرەڕۆیی پەیڤەکاندا..
تورە بووین
من‌و تۆو گریان
رژاینە سەر رومەتی حەسرەتەکان‌و..
بە کەناری هەنسکدا.. وشك بوینەوە
من‌و تۆو دابڕان
لە ولاٚتێکی پڕ لە  قەزاو قەدەردا

پێشبینیمان کرد
.. منو تۆ.. منو تۆو...
منو تۆو..
بەلاّم منو تۆو ژیان نا
ئەمە دوا برِگەی گۆرانیەکەی تۆ بوو
لەبیرت چوو پێم بڵێی
منو تۆو مەرگ
دەتوانین ببینە دوا وێستگەی شەمەندەفەری بوونو..
ئاورِ لەیەکدی نەدەینەوە
ئەی یارە نەفامو سەر شێتەکەی من
وەرە بێرەدا تێپەرِبە
بە مندا
بزانە, عورفـو عادەتی تۆو غەدر
لە چ قوژبنێکی ئەم جیهانەدا
دوێنێم لێ قەد دەکاتـو..
سبەینێشم لۆچ لۆچ دەکا





حاڵیی بوونیش ناتوانێ
ئینشایەکم پێ بنوسێتەوە
تا رابردوو,
لە بیرەوەریمدا بتەکێنم
ئایندەشم ئوتو بکەم
دە وەرە
وەرە بێرەدا تێپەرِبە
بە ناخمدا
ئەم هەموو "بەرد"انەم بۆ کۆناکرێتەوە
دەیانگریتە من
ئەم هەموو پێکەنینە درۆیانەم بۆ ناکرێ
دەبنە فرمێسکی رقی تۆ
ئەم هەموو ئاگاییە بەمن ناکرێ
تۆ لە گوێی شێتی خۆتدا نوستبی
وەرە بێرەدا تێپەرِبە
بەمن نا, بەناخم نا, بە گەردوندا

**خودا بەو هەموو ناوانەی خۆیەوە**
**نەیتوانی ئوسڵی لەش پیسی ئاسمانو..**
**ئوسڵی بێ نوێژی خاك دەركات**
**تاكو..**
**لە دو ڕكات شۆڕبونەوەدا**
**بگەنە عەرشی ئاو**
**بەو گەورەیەی خۆیەوە**
**نەیتوانی**
**رۆحەكان بناسێتەوەو..**
**(ئادەمو حەوا)كان لێك جیاكاتەوە**
**ئیدی من چۆن دەتوانم**
**گرێ كوێرەی ئەم هەموو پرسیارانە بكەمەوە**
**لە لای تۆ  سەر هەڵدەدەن..؟**
**چۆن دەتوانم**
**ئەم هەموو گومانانە**
**بەتەك پارچە ئاوێنە شكاوەكەی..**





**نێو جانتاكەم..**
**جێیان بكەمەوە**
**چۆن دەتوانم**
**منو تۆو ماچ فەرامۆش بكەم**
**كە هەرسێكمان**
**بووینە تاتە شۆری..**
**سەر گۆنای شەونمو..**
**بەباڵای لاسكە گیایەكاندا..**
**رێگایەكمان بۆ شۆڕبونەوەو..**
**ئاوێتە بوونی رۆحەكان دیتەوە**
**چۆن دەتوانم.. منو تۆ لێك جیاكەمەوە**
**كە هەموو "من"ەكان لەتۆ دەچنو..**
**هەموو "تۆ"یەكانیش لەمن..**

2005/8/13

# بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

خودایە..
ئەی میهرەبانترین میهرەبان
ئەمشەو چ کڵاوێکم پێ دەچنی
بۆسەری ئەو قەسیدەیەی
نۆ مانگ‌و نۆ رۆژی خۆی تەواو نەکرد
لەدامێنی قەڵەمەکەم, بەربووەوە کۆشی شیعرو..
بە حبرێکی کول ناوکیت بڕی..؟
چۆن دڵت هات
مەچەکی ناخی زەیستانم بگریت‌و..
لە شەوچەرەی پیاوەتی خۆتدا
ناونیشانێک,
لە گورگانە شەوەی پیاوم پیا بدەی ..؟
ئەی سەرابترین سەراب
لەژێر هەنگڵی ئەمشەودا بووم بە هەڵم





بۆ لە خۆمم یاخی دەکەی..؟
لە بادەی پیاوێکیشدا
بۆ چ سەرمێزێک
ئەم روتەنیەی من,
وەک (با) خەیاڵێک دەیبا ..؟
خۆ من.. یاریم بەئاگر نەکردبوو
تا ئەمشەو یار .. قامکەکانم بسوتێنێ‌و..
ئاهو ئازارەکانمی پێ بژەنێ
خۆمن.. لە سەرابدا خۆم وون نەکردبوو
تا ئەمشەو یار.. نوقمی لمی خەتام بکا
خۆمن.. لە ئۆقیانوسدا مەلەم نەکردبوو
تا ئەمشەو یار.. بە ددانی (ئۆرکا)یەکی تورە
لەت لەتم بکات
خۆمن.. گەمەی چاوشارکێ‌و..
جوینی پەیڤەکانم نەدەزانی

تا ئەمشەو یار.. سەد نهێنی ئەژمار بکاو..

پێم بڵێ:

سەیر ناکەم لەکوێ خۆت حەشار دەدەی

ئەگەر چاوم کردەوە باوکم بمرێ

خۆ من.. نێچیری ئەڤینو نیڤین نەبووم

تا ئەمشەو یار.. لەدارستانی گوماندا.. راوم بکا

خۆ من .. خیانەتم لە شەو نەکردبوو

لەنێو باخەڵی رۆژێکدا

مومارەسەی نوستنێکم نەکردبوو

تا ئەمشەو یار.. خەونەکانم لێ حەرام بکا

خۆمن.. هێشتاکە رووتی خۆم بە روونی نەدیتبوو

تا ئەمشەو یار.. لەئاوێنەی ناخی خۆیدا

لێڵم بکا

خۆ من.. عیشقم نەکوشتبوو

تا ئەمشەو یار.. بە گریان مەحکومم کا

ئەی بێکەسترین کەس





سەیرە ئەمشەو

( گێژەڵوکەی شەرو.. تۆفانی مەرگ دایکردووە )

بووم بە جگەرەیەک بە لێوی حەسرەتێکەو..

قوم لەدوای قوم هەڵمدەمژێ

تا دوا قوم

لە تەپڵەکی گوماندا, دەمکوژێنێتەوە

خودایە

لە هیچ شەوێک ناچێ ئەمشەو

ئەستێرەکان بە گەمژەییم پێ دەکەنن

درەختەکانی حەوشە چەمۆڵەم لێ دەنێن

سەرینەکەم دەبێ بەبەردو..

تەوێڵی راکشانەکانم دەشکێنێ

مانگ بە رومدا پەنجەرەی تریفە دادەخاو..

هەقایەتی لەیلو مەجنونەکانم لێ دەشێوێنێ

ئەی ساحیرترین ساحیر

دەکرێ ئەمشەو لەپی دەستی چەپم بخوێنیتەوە..؟

بەڵکو ئەم خورافاتە..

شتێك بڵێ لەدەستی راستم دابێت

تا بزانم حەقایەتی ئەمشەوم

وڕینەیە یان حەقیقەت..؟

ئەی عاشقترین عاشق

ماچێکی خەستم پێیە

بۆت دەهێنم,

گەر پێم بڵێی ئەمشەو دارمێوی ئەوینت

لەکام رەزدا خۆی دەنێژێو..

دەبێتە کەپرو سێبەری کام تابوتی موحیببەت..؟

ئەگەر نا

بەرسیلە عیشقێکم هەیە

لە یاری دەسەنمەوە

دەیبەخشم بەتۆ

2005/7/9

تێبینی: وشەی (ئۆرکا) ناوی نەهەنگێکی دڕەندەیە

## بۆ کام ئاسمان.. ئارەزووی فڕینت کردم..؟

میوزیکت باش..
هۆ میوزیك ژەن
وەرە حاڵیم بکەو.. پێم بڵێ
ئاوی چ خەتایەکت کرد بە قوڕگمداو..
چ ئەوینێکی ئەفسوناویت چپاندە گوێم
بە نیگا نەرمەکانت.. چ داستانێکت بۆ خوێندمو..
بەنەشئەی کام خەیاڵدا.. ئارەزوی فڕینت کردم
لەخەونی کام هەوردا
گیرفانەکانمت پڕ کرد لەنوقڵە باران
بەخەندە لێوی کام گوڵی باخچەی سۆزت
پێشوازیت لە پەروانەم کرد
بە نیگاکانی کام چنار..
تەماشای باڵات کردمو..
بەفڵچەی کام نیگارکێش



بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

لەزمانی رەنگەکانم حاڵیی بووی
بەهەناسەی کام ژمارە..
ئیمێڵێکت بۆ ناردبووم
( سڵاو.. سڵاو.. هاوڕێ سڵاو
ئازیز سڵاو..)..؟
سڵاو لەتۆش هەناسەکەم
دە..بۆ لەحزەیەك بمبەخشەو..
ساتێك بۆ عەدەم بمژەنەو..
شیعرەکانم بهێنە سەما کردن
تا چ لە ئەرشیفی رابردوومدا هەیە
پەڕ.. پەڕی کەم
کەپرە لە بێدەنگی
لەتەنیایی
لەبۆنی سوتاوی حەزو
لەنامۆیی

وەرە بۆ ساتێک بمژەنەو..
ئاوازەکان یەکە.. یەکە
برژێنە نێو کاسی مەستبوونم..
مەستم بکە
بە زمانی ( دۆ.. رێ..می)
یەکەم پیتی ناوم بێنەو..
بە هەستی ( فا.. سۆ.. لا.. سی)
هەناسەم بهەژێنە
وەرە بۆ ساتێک بمژەنەو..
ماچی لێوی (نای)م لەسەر لێو دابنێ
ملوانکەی (کەمانچە) لەگەردنم کەو..
سۆزی ( ساز ) ێکم بدەرێ
تۆ لەگەڵ دەنگی نۆتەکان
گوێچکەی عیشقمت کردەوە
لە ئاسەوارەکانی مەرگ
منت گەڕانەوە ئێرەو..





لە ئەدرەسی دۆڕاندندا
مەدالیای سەرکەوتنت دایە دەستم
تۆ لەگەڵ ریتمی پیتەکان
سەفەرێکت لەگەڵ شنەبای وشەدا پێ کردم
لەگەڵ قەدو باڵای شەوێک
ئامێزت بۆ ئەستێرەکانم کردەوەو..
بە تریفەی سەر لێویان
ماچت لەگەڵ پەنجەرەی ژورەکەمدا دەگۆڕیەوە
تۆ..
تۆ داستانی سروشتت بۆ گێڕامەوە
کاتێ (دەریا) ویستی لاسایی شەپۆلە نەرمەکانی (کانی) بکاتەوە
(کانی)ش ویستی بۆ رێبوارێک ..
حەز لە ساردی بەفر بکات
بەفریش ویستی لەسەر بەرزترین چیا
لەبەر پێی هەتاوێکدا بتوێتەوە..
هەتاو ویستی لەداخی ماڵئاوابوونی

برژانگەکانی رەقتر کات
بررژانیگیش ویستی بەو پەڕی شانازیەوە
خۆی بە چاوی کچە کوردێك ئاشنا بکات
تۆ پێت ووتم
ئەگەر ئێمە  ناشرینو خراپ نەبین
دونیا جوانە.. ژیان باشە
ئەگەر ئێمە خاوەن لولەی تفەنگو..
چەقۆ نەبین
جەلاد هیچە
ئەگەر ئێمە
کوفر لەگەڵ نوستن نەکەین
خەونی ناخۆش نابینین
ئەگەر گوێ لە ئێزگەکانی ناوخۆ بگرین
لەم شارە بێ ئاگا نابین
کە هەموو دەم فەلسەفەیەکی نوێترو..
مەتەڵێکی سەیرتر دەگێڕێتەوە
ئەم شارە هەموو شەوێك





کوچەکانی
تریفەی خەتای تیا دەڕژێو..
بەرۆژیش شەقامەکان..
تەماشاکانی گومان لێی رادەوەستن
تۆ پێت ووتم
لەم شارەدا
هەینیەکان خاڵین لە فەتوا
میحرابەکان خاڵین لەنوور
عاشقەکان خاڵین لە پاکی
بیرەکان خاڵین لە یوسف
دەی میوزیك ژەن
با هەردووکمان
بەپەنجە  لۆکەیەکانی پەپولە
گوڵ بژەنین
دەسماڵەکانی هەنگ بدەینە سەرشانمان
ببینە مامانی ئەو هەورە ئاوسانەو..
چاوەکانی خاك تێر بکەین

بە بینینی دڵۆپە باران.. نەك خوێن..
بەگریانەكانی خودا
گەروی درەختە تینووەكان تەڕ بكەین
بە فاتحای وەفایەك
وەرزەكان لەیەكدی مارە بكەین
دەی میوزیك ژەن
وەرە بۆ ساتێكی شەرمن بمژەنەو..
بەئاوازە خوێن گەرمەكان
شیعرێكی ئەسمەرم پیێ بنووسەوە
لەكەرنەڤاڵی خۆكوشتن رزگارم كە
سەبەتەی خەیاڵم بەتاڵ بكەرەوە لە سێوەكانی حەوا
دەی میوزیك ژەن
وەرە پڕم بكە لە هەستو نەغمەی خۆتو..
خاڵیم بكەرەوە لە خۆم

2005/4/9

# واقیعم بە خەیاڵ چنراوە

مەڵێ مەگری
تۆ نازانی ئەم دڵۆپە فرمێسکانە چی دەڵێن و..
چ داستانێ لە خەمستان دەگێڕنەوە
تۆ نازانی..من رۆژانە
هەودای خەیاڵم لە دەرزی واقیع هەڵدەکێشم و..
کراسە دڕاوەکەی ژیانمی پێ پینە دەکەم
تۆ نازانی.. هەموو رۆژێک
لەمیحرابی خەیاڵێکدا..
نوێژ بۆ زیندوو بوونەوەیەکی دی دەکەم و..
هەموو شەوێک بەر لەوەی دەست بنێمە گەردنی خەو
تاوێک لەگەڵ خەیاڵدا
بۆ هەڵدانی شەرابی نوستن
گروگاڵ دەکەم..
تۆنازانی





خەڵک دەنوێ و..
منیش بەباڵی بوراقێکی ئەندێشە
ئارەزوی فڕین دەکەم
فڕین بەرەو ئەو ئاسمانەی
خودای لێیە
ئەو خودایەی تەنها بەخەیاڵ بینیومەو دەیپەرستم
بەهەشتی لێیە
ئەو بەهەشتەی تەنها بەخەویش نایبینم و..
پێنج فەرزە سوژدەی بۆ دەبەم
دۆزەخی لێیە
ئەو دۆزەخەی هەموو رۆژێک..
بە دەستی داب و نەریتێک دەمسوتێنێ و..
بۆکروزی گیان و جەستەم دەمخنکێنێ..
ئارەزومە بچمە ئەوێ
لەوێ ببمە میوانی مەریەم و حەوا

پێیان دەڵێم ئەوە هاتوم

تاکو پێتان راسپێرم

لە ئەندێشەی ئێوە نیم

ئەو فردەوسەی ئێوە ویستان

من نامەوێ

لەبەر ئەوەی..

حەزەکانم لەوێندەر لەماڵی خودا

دیلن.. دیل

دەمەوێ بچمە نێو دۆزەخ

تا لەوێندەر بە یادگاریەکان ئاشنابم

ئەو کاتانەی هەموو تەڵە پرچێکم

دەبونە حەزی سەمای پەنجەکانی کوڕێک و..

لێوی تەڕم

دەبووە شەرابی لێوێک و..

ئەو ساتانەی لە بەرامبەر ئاوێنەکەم

خۆم بۆ ئەو یارە جوان دەکرد

وانەی خوێندنەوەی چاوی پێم دەوتەوە





ئەمانەو چەندین حەزی دیم لەدۆزەخن

هیچ یادێکم نیە لەبەهەشتو..

هیچیشم پێنیە بۆی

تاکو ئێستا

بە عیبادەتی خواوەندێکی خەیاڵی

هەموو حەزەکان زەلیل بکەم

نا.. نازانی

هەقتە پێم بڵێی مەگری

چونکە تۆی کوڕی واقیعو..

بوون لەتۆوە دەست پێدەکات

منیش لەو رۆژەی لەدامێنی دایکم بەربومەوە باوەشی

دونیاو..

ناوکیان بڕیم

بۆئەوەی زوتر پەردەی گوێم بکرێتەوەو..

خۆم بناسم

هاتن و چپاندیانە گوێم

ووتیان تۆ کچی (خەیاڵ)ی .

# حەیرانێك بۆ برینەكانی خاك

من سوارێك بووم بێ تەجروبە لە سوار بووندا
ڕێبوارێك بووم بەكۆڵێ پڕ لە خەمەوە
بەسەر شان و یەخەمدا
ڕێگەم دەبڕی لای ژیان
بەبێ ئەوەی بیناسم
یا ناونیشانی بزانم
لەكوێوە هات بۆ كوێ دەڕوا
لەكام میحنەت سەری هەڵدا
نەوەی كێیە
ماڵی كەوتۆتە كام گەڕەكی دنیاوە
نەمدەزانی
تا گەیشتمە پیشانگایەك
پەردەی سەر برینی یەكەمم هەڵدایەوە
هیچ لەماناو ڕەنگی مردن حاڵیی نەبووم





كە دەمبینی دوكەڵێكی ڕەش دەبارێو
داس.. خەمی دەدرونیەوەو..
سیروان شەپۆلە خوێنی دەدا..
بەرداش دوكەڵی دەهاڕیو..
بێژەنگ تۆزی دەدایە (با)..
چەندین پەپولەی مەمكە مژ
لە ئامێزی خونچەكاندا
وەك هەزاران گوڵ فریشتە
هەناسە هاوێر كرابوون
شەهرەزادو شەهرەیاریش
بە دیار وەهمەكانی هەزارو یەك شەوەوە ڕاكشابوون
تازە گوڵ و قەیرە گوڵ و باریكە گوڵ
پێنج هەزار خەیاڵ بەباڵێك
بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕین
تا هەندێك سۆز بخەنە نێو دڵی خوداو..

تاوێك گریانەكانی ..

بەسەر گۆنای نیشتماندا بهێننە خوارێ

پەردەی سەر برینی دووەمم هەڵدایەوە

هەمان سەراب هیچ لە مردن حاڵیی نەبووم

گەر چی وەك زەنگی مردنی هەناسەكانی یەكەم تابلۆ

لەمەیان بووەتە گەردەلول و..

ئەهریمەنیش..

منداڵ دەباو گریانی بۆ ئەندێشەكانی خاك بەجێدێڵێ

ژنان دەباو ..

مەمكیان ئابروی تکاوی قەحتان و عەدنان دەیدزن

پیاوان دەباو غیرەتیان ئەڵقاوێز دەكات

پیرە ژن و پیرە پیاویش

لەپەنای سێبەری حەسرەتەكانی ئەوان پاڵكەوتبوون

بەپاڵتۆیەكی دڕاوی پینە كراو

بەئەسرینێكی شاراوەی نادیار لە چاو دەهاتە خوار

تەزبیحێكی قەزوان





دەنك دەنك مەرگی هاتنەوەیان دەژمارد

تا خەتمیان كرد

برینێ دیم هەڵدایەوە

برینێ دیو برینێ دیو برین برین

سەرم سورماو حاڵیی نەبوم

برینێ دیم هەڵدایەوە

منداڵێك هاتە بەردەمم

لێمی پرسی

خانمی بەخەمی ئەم چەرخەم

مانای ئەم برینە چیە بە دیواری زەمەنەوە

هەستم كرد دۆڵ و بێشەكان لە پرسیارەكانی ئەوو..

كۆشی بێدەنگی مندا كپ بوون

جۆگەلەكان تینوی قومێك ئاشنایی بوون

گەلاَی دارو درەختەكان

هەناسەیان هەردەم سوارو..

چاوەروانی هاتنەوەی شەماڵ بوون ..

بۆن و بەرامەی بەسەر ئەم وولاتەدا پەخش بکات ..
منیش لەژێر باری ڕەشماڵی خەفەتا
هاتمە وەلام
« جەژنی قوربانە بە قوربان جەژنی قوربان
نۆبەتی قوربانیە ..
بۆتۆ قوربانی کوردستان
گیانی من قوربانتە»
هەیهات 00هەیهات
لە نێو ئەم تابلۆیەدا گەردوون وەرگەڕا
کاتێ جریوەی چۆلەکەو ..
قاسپەی کەوو..
گمە گمی کۆترو.. گریانی قومری
هاژەی چەم و.. ناڵەی کەنار
شنەی گەڵاو..
دەنگی شمشاڵ
گوڵە نێرگز دیاری بەهار





چەپک.. چەپک.. پێشکەش دەکرا
ئەو بەهارەی ئەرخەوان
دەیان گوڵی برایەتی دەپشکاندو..
دەم پێکەنین, ڕووخسار ڕەنگین
هەمان تابلۆو.. هەمان برین
خەندە گریا، ڕووخسار وون بوو
نێرگز سور بوو،
هەورێکی ڕەش، برژانگی خۆری هەڵوەراند
ڕەشەبایەک لق و پۆپی ئەرخەوانی شکاند
قەلە رەشکە بە قیغە قیغ
باڵندەکانی کپ کردو..
شەماڵ لوول بوو، گەردەلوول بوو
جۆگەو کانی بوون بە دەریایەکی خوێنین و شەپۆلیاندا
سەدان قوربانی بەجارێ پێشکەش کرا
لەنێوانیان دوو پەپولە
پەرو باڵیان هەڵپروکا

**کاتێ کەخۆم هاتەوە یاد**
**چاك حاڵیی بووم**
**لە پیشانگای نیشتمان دام**
**ئەمە تابلۆی زامەکانی خاکی منە**
**بوون بەبیابانێکی ڕەش بۆ داڵەکانی مەرگ**
**ئەوە ئێمەین..**
**گومان دەکەین لەسەفینە گەورەکەی نوح**
**یان خۆمانین**
**لەبەلەمێکی ئەفلیجی سەر وشکایی**
**ئەدی کێیە لایداوەتە قەراغ دونیا**
**(ئیبراهیمە) یا (زەردەشت)**
**لەو تەختاییە عیبادەت بۆ خاك دەکات**
**ئەی هەر خودای ئەوان نەبوو**
**ئەم تابلۆیانەی دەکێشا**
**دەنگێ نەبوو, وەڵام نەبوو**
**لە پڕ هاوارم کرد..هاوار**



بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

**ئەی شێوەکاری ئەم دونیا**
**ئەی ئاهورا**
**تاکەی لەحزوری عەرشت**
**ناڵەمان بەرگی حەوتی ئاسمانت ببڕێ**
**دەخیلە چاوێ هەڵبرە**
**تاکەی نەوەی ئەم زەردەشتە**
**بەسەر پردی سەبری ئەیوبدا هەنگاو بنێ**
**تاکەی گوڵاڵە سورەی من**
**بەخوێنی خۆم ئاو بدرێ**
**تاکەی دوندو ترۆپکانمان..**
**تارای ڕەشەبا بپۆشن**
**تاکەی ئەی ئاهورا تاکەی..؟!**

**تێبینی: ئەم قەسیدەیە لە نامیلکەی "پیاسەیەك بە کوچەکانی قەدەردا" بڵاو کراوەتەوە بەڵام ئارەزوم کرد بە هەندێ گۆڕانکاریەوە دوبارە لێرەدا بڵاوی بکەمەوە**





## کۆچیٚك لەهەست.. هەستیٚك لەئەندیٚشە

ئەم جارەش خەمیٚکی دی مرخە مرخی دیٚو..

دەیەویٚ بە پەنجەی هەستیٚك

مەلاٚشووی کۆچ هەلٚداتەوە

چرك.. چرك

چرکە چرکی کاتژمیٚری ژورەکەشم

گویٚچکەی هەستەکانمی کاسکرد

بەوتنەوەی گۆرانی ( دەوران دەوران )و..

پیٚم دەلیٚ:

ئەم وەرزە وەرزی سەفەرەو..

لەپشت بەیانیەکی خەمگین

بەرلەوەی خۆر چاو هەلٚبیٚنیٚو..

( مەسکارە ) لەبرژانگی بدات

بوخچەی تەمەن دەنیٚتە کۆلٚ

بەسواری کەشتی لەنیٚو دەریای ژیاندا





شەپۆل.. شەپۆل

بەرەو مەرگ, هەنگاوە شەپۆل دەنیٚیتو..

ئاورٍ لەبوون نادەیتەوە

لە میحرابی بیرکردنەوەیەکی قولٚدا

دەستنویٚژ بە ئاوی پەشیمانی هەلٚدەگریو..

لەسەر دەستی خەتیبی خەم

تەوبە لە عیشقیٚکی حەرام دەکەی

عیشقیٚك .. زینا لەگەلٚ خۆشەویستی دەکا

هەستیٚك دەلیٚ

ئەمرۆ بۆ دواجار وەهمستان بەجیٚدیٚلیٚو..

حاشا لەشای ئەو مەملەکەتەش دەکەی

لەبەر ئەوەی..

سۆزت لەوەهم دروست بوو

بۆیە تیرۆر کرا

گولٚی سورت لەباخچەی وەهمدا چاند

بۆیە (وڵە) یەك رەگەكانی بڕی
وەهمە گەر ئەمڕۆ بتەوێ
لەبەر هەناسەی ( ڤالانتاین )
لەباتی گوڵی سور.. لێوی سور ببەخشیو..
لەباتی كارتی رەنگاو رەنگ
ماچی رەنگاو رەنگ ببەخشیتە خۆشەویست
دەوران.. دەوران..
فایلی جاشەكانی دەوران .. دەوران.. ئاشكرا دەبێت
كاتێ خودا بوو بە شایەدی گۆڕی بەكۆمەڵو..
خوێنی جەلاد تێكەڵ بەخوێنی شەهیدو..
دوژمنی مێژوو بووە بە هاوپەیمانو..
( تۆ )یەك وەك دوكەڵی جگەرە بووی بە وەهمو..
منیش بووم بە جانتای سەفەر
لەگەڵ سێبەرێك كۆچ دەكەمو..
لەگەڵ كۆچێك.. شەرابی خەم دەخۆمەوەو..
لەگەڵ هەڵدانی گشت پێكێك لە بیرت دەكەم





تا مودمن دەبم بە لەبیرچونەوە
دەوران.. دەوران
دوێنێی تۆ .. ئەمڕۆی منو .. سبەینێ خودا

2005/2/12

## قەدەر, بوخچەی مەرگی پێ هەڵگرتی

**پێشکەشە بە رۆحی هاورێم(خەلیل عبدالله)ی جوانە مەرگ**

هاورێ..
بۆکوێ دەرۆی..؟
بۆ کوێ بارگەت لەکۆڵناوەو سەرهەڵدەگری
بێ ماڵئاوایی, سنور ئەبری
تۆ نازانی ماڵی غوربەتو تەنیایی
لەکام گەرەکی ژیاندایە؟
ئەی نازانی ئێوارەیەو.. خانمی تۆ چاو لە رێیە
دەستێکت لە دەرگا بدا
بەبزەیەکی خەم لێنیشتوو..
لەحەوشەکە بچیە ژورێو..
لەپاش گێڕانەوەی, دەنگی کاسی دونیا
لەسەر فەرشێکی فیردەوسی دڵ ڕادەخا
ئەی نازانی حەمە چاوی بەدەرگاوە
ئەسپی هەمیشە داناوە





کەچویتەوە دەچێتە را..؟
نڤارو سۆما,
دەستیان ناگا بە وێنەکەت
تا پێی بڵێن:
بابە گیان کەی وەختی کۆچ بوو بگەرێوە
وارش لەسەر میحرابی راستی هەڵدەوەو..
وەکو جاران بە شێنەیی بۆمان بدوێو..
بگەرێوە
بابە گیان  نۆرەمان هات دەفتەرو قەڵەم هەڵبگرین
گەر تۆ نەبی
باسی گەمەی نێوان خۆمانو هاورێکانمان لای کێ بکەین
کارتی دەرچووی وانەکان بەکێ ئیمزای کەین
هاورێ گیان .. ئەی بەڵێن نەبوو
بچین بۆ تەختی سەرو..
لە ماڵی خودا هەندێك سۆز بهێنینو..

له ماڵی گوڵ, هەندێك جوانی قەرز کەین‌و..
لەماڵی پەپولە  بەرائەت هەڵبگرین..
لە خاکی وەرزە ئاشوبەکان برایەتی خەلقکەین‌و..
لەماڵی خۆت کامێراکەت
لەکاسێتێکی داخ ملیم
پێشکەشی کەرکوکی بکەین..؟
ئەی بەڵێن نەبوو
ئەو بەیانیە.. زوتر لە رۆژانی پێشوو
جیاواز تر لە سەفەرەکان‌و..
پەلە تر لە هەناسەی دی
لەگەڵ هەورازو محەمەد
بێیت‌و سەردانمان بکەیت..؟
تۆ وتت دێم‌و نەهاتی
زیاتر لە هەنگاوەکانی رۆیشتن بەرێ کەوتی
زیاتر لە هەڵگرتنی جانتای سەفەرت .. گشت خەمی
دونیات لەشان کرد





بۆ کۆچت کرد..؟
من هاتم تۆ دەرۆیشتی
تازە تازە رووم لە کامێراکەت دەکرد
پشتت تێی کرد
یەکەمجار بوو خەندە ببێ بە میوانم
بەشیوەن پێت دەرکردم
ئەو رۆژە چاوەڕێم کردی
نەهاتی‌و هەر نەهاتی
"بەدەستێکی پڕ لە مەرگەوە
هاتی
بزەی منت,  لەگەڵ کزەی جەرگی دایکێکی ئەنفالدا
لێک شەتەکدا"
هاوڕێ گیان
تۆ دایکێکت هەتیو کردو..
شەونمێکت بێ ئاو کرد
باڵی پەپولەکانی, باخچەی ماڵەکەت هەڵکروزان

تۆ شیعرەکانمت شەهید کرد
پێکێک خوێن, بە شامەزەی قەدەرەوە پێ فڕکردم
ئەوەتا بەجێتهێشتینو..
منیش چاوێکم دەوێ خەمی شارەکەم ببینێو..
ژانەکانی بگەیەنێ
ئەی نازانی..
گەر تۆ نەبی
زوومی کامێراکان چاویان لێڵ دەبنو..
ئەستەمە لەو شەقامەدا بپەڕێنەوە
کە ڕۆژانە..
شۆفێرەکانی ترس پیایدا دەڕۆن
دەستی ڕەشیش
سوکانەکان دەشکێننەوە سەر سەرمان..؟
نەهاتیو.. هەر نەهاتی
دەنگت نایەت
دەنگەکانی دیش نووساون



بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

هەناسەت نایەو ناڕوا
هەناسەکانی دیش..
لە تەمەنی شارەکەم بە فیرۆ چوون
هاوڕێ گیان
ئەوەتانێ.. قەلاّ پشتی دانەوان
ئەڵێ ئەگەر بالاّکەی خەلیل نەبێ
کێ بەرزیو راگری من دەبینێ
باوە گوڕ گوڕ ئاورینگ دەدا
ئەڵێ ئەگەر داخ لە دڵێکی وەک دڵی خەلیل نەبێ
کێ بۆ ئەوینم ئەسوتێ
ئاسمان حەسرەت دەبارێنێ
ئەویش دەڵێ
ئەگەر چاوی کامێراکەی خەلیل نەبێ
کێ تەماشای فراوانی دڵم دەکات
ئەو بەهارەی سیمای سەوزو پرچی پەلکە زێڕینە بوو
ئەمێستاکە رەنگی زەرد هەڵگەڕاوەو..

بەتاو پرچی خۆی ئەڕنیٚ

بۆ ئەو قەدەرەی,  بوخچەی مەرگی پیٚ هەڵگرتی

بەڵام خەتا لە تۆ نەبوو

کفن کویٚر بیٚ کە خۆی پیٚچاوە پیٚتەوە

گلٚ کویٚر بیٚ کە تۆی شاردەوە

نەوەك هاوڕیٚ

کەی وەختی کۆچو سەفەرو..

ئەی کەی وەرزی هەڵوەرین بوو..؟

**مارتی** 2005

# پارچەکانی نازو نەفرەت لەگەڵ یاردا

## خەم

چۆن وازبهێنم لە خەم
کە خۆم  پارچەیەك بم لەخەم..؟
ئەگەر منیش لە خەم خاڵی ببمەوە
خەم خاڵی نابێتەوە لەمن ..!

## سوتـان

هەر چەندت دەوێ بمسوتێنەو..
ئاگر لە جەستەم بەربدە
فرمێسك دەیكوژێنێتەوە
بەلاًم نەكەی بێیت ئاگر لە دڵم بەردەی
چونكە تۆی تیا دەتوێتەوە





## فرمێسك

بریا دەبووم بە فرمێسكێو..
لە نێو منداڵدانی  چاوت لەدایك دەبووم
لەسەر لەپی رووتەكانت دەژیام..
بەتەك لێوەكانتەوە نەدەمام و دەمردم..!

## ئاوێنە

بۆچ دەڵێی ناشرینم
هەموو ئەو ئاوێنانەی بەتۆ دەڵێن ناشرین
درۆدەكەن
تۆ وەرە لەناخی مندا خۆت ببینە
ئەوسا دەزانی چەند جوانیو..
ئاوێنەكان

تەنها غیرەیە پێت دەبەن..

## رقم لێتە

ئەو دوو وشەی

رێگەی پێدام بە ئاسانی..

لەدەرگای خۆشەویستیدا بچمە ژورێ

ئەو دوو وشەی

فێریان کردم پێی بڵێم خۆشم ئەوێ

## چیرۆک

منو تۆ

چیرۆکی دەستی  قەدەرێکی سەر شێتین

رۆژێک دەمانگرێنێو..

رۆژێکیش دەستی پێکەنین دەگرێو..

دێت لەدەرگای خەندە دەدات

## بۆ بێ دەنگی..؟

ئەم بێدەنگیەت دەمکوژێ..
ئەم دوریەت شێتم دەکات
ئامادەم هەموو دونیا بکەمە وشەو..
لەدێرێکی وەلامتدا.. بیخەوێنم
تا بەزەنگی پێتێکت چاو هەڵبێنن
ئامادەم هەرچی ئەستێرەو مانگیش هەیە
لەشەوگارێک بسێنمو..
بەدیاری بۆ تۆی بهێنم
تا بێداری تریفەیەک نەترەنجێنێ
ئاسمان دەکەمە فەرشێکو..
لەژێر پێتدا رایدەخەم
تاکو فرین باڵەکانت بە هیلاک نەدا
بەتەک دەروێشێکەوە زیکرو..
بەتەک سۆفیەکەوە نوێژەکانم ئەدا دەکەم





دەسم پڕ دەکەم لە دوعاو..
هەواڵەی ئاسمانی دەکەم
بەڵکو دەنگم لە گوێیەکانتدا بزرینگێتەوەو..
بمبەخشی بە وەڵامێک
تەنها بەدێرێک وەڵامێک
لە بێ دەنگی بەرد حاڵیی بوومو..
فێری کردم لە شوێنی خۆم سەنگینم
لە بێ دەنگی دیوار حاڵیی بوومو..
فێری گوێڕایەڵی کردم
لە بێ دەنگی سیس بوونەوەی گوڵێک حاڵیی بوومو..
فێری کردم بە جوانی خۆم نەنازم
بەلام هەرگیز لە بێ دەنگیت حاڵیی نابم
ئەزیزم بۆ بێ دەنگی..؟
ئەم بێ دەنگیەت دەمکوژێ
ئەم دوورییەت شێتم دەکات

## تەوبەیەو.. بڕیاریش دەدەم

گەر کەوانی دەستی دوێنێم
تیر بۆ سبەینێم بهاوێ
دەبێ ئەمڕۆکە بڕیاردەم
تەوبە بکەم لەتۆ ئەی پیاو
تەوبە لەوەی جارێکی دی نەتپەرستم
تا بۆ تۆزقاڵێک لەزەت,
لەنێو باخەڵی شەوێکداو..
پێکێک لەماچو راموسان
لەنێو پەرداخی مەستبوونداو..
هەناسەیەک لەهەستو.. سۆز
لە درۆو لە بەزەییدا
بێم سوژدە بۆ قیبلەت ببەم
تەوبەیەو.. بڕیاریش دەدەم
دڵم لەبەرد مارە بکەم





تا بەشکان نەمشکێنی
بەکۆڵوانەیەکی گوڵەوە, دەچمە دیدەنی ئەهریمەن
تا فێری سەماکردنم بکات لەگەڵ ئاگر
نەک بەسوتان بمترسێنی
دەبمە دەروێشێکی (ئاواو..
لەگەڵ هەور دەف لێدەدەم
لەگەڵ باران پێدەکوتم
تاوێک لەگەڵ خۆمو خوادا زیکر دەکەم
تا تاوانەکان تەڕببنو..
بەوشکی نەیانقڵیشێنی
ئەی پیاو تۆ بەشێک لەبوغزو..
من فریشتە
تاکەی دەرگای ئاسمانم لێ کڵۆم دەدەی
دەمەوێ بە باڵە شەفافەکانم چەپڵە لێدەم ..
بفڕم.. بفڕم ..

فڕین بەناخی دوورییدا بچمە خواریٚ

تۆی لەمن و.. من لەئاسمان

تاکەی دیواری جوانیم لێدەڕوخێنی

دەمەویٚ خۆر بکەمە کراس و.. بیکەمە بەرم

مانگ وەك گولٚ بدەم لەپرچم

ئەستێرەکان وەك زەنگیانە بهۆنمەوە بۆ گەردنم

چ ئەستەمە هاوڕیٚ .. چ ئەستەمە

تێپەڕبوون بیٚ ئاوڕدانەوە

ئاوڕدانەوە لەعیشق .. عیشقی سەراب

ئاوڕدانەوە لەمەرگ .. مەرگی پێش وەخت

ئاوڕدانەوە لەخۆم لەنێو تۆدا

نا.. ئەی هاوڕیٚ

ئیدی نەفرەت لەو قەترە شەرمە دەکەم لەئاستدا..

بەتەوێلٚمدا دەچۆڕیٚ

ئیدی نەفرەت لەو دلٚۆپە فرمێسکە دەکەم تۆ دەیبینی

ئیدی نەفرەت لەسالٚ دەکەم

کە شەریعەت ریٚگەی پێدا وەکو تۆ چوار ژن بهێنیٚ



بەرسیلە عیشقیٚ بۆ خودا

بەهار چی بوو..؟

هاوینی بەسەردا هێنا

کە چووە داوای پایزیش

هاوین رەنگی زەرد هەلٚگەڕاو..

تینو.. تینو وشك بووەوە

پایز زانی (هەوە) بەسەر ئەویش دادیٚ

هەموو پرچی خۆی رنیەوە

کاتیٚ زستانیشی خواست و..

گەڕایەوە بۆ لای بەهار

زستان سەری سپی بوو

ئەمەیە هاوڕێیەتی تۆ لەتەك مندا ئەی هاوڕیٚ

ئیدی چۆن نەفرەت نەکەم لەئایەتەکانی خۆم

کە تۆ دەیانخوێنیتەوەو..

هەر جاری بەشێوەیەك تەفسیریان دەکەیت

نەفرەت لەنەفرەترین نەفرەتی جیاوازی

کە رۆژەکانیش دابەش دەکەن

شەممە لە تۆ یەك شەم لە من

بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا

**دووشەم لەتۆ سێ شەم لە من**

**چوار شەم لەتۆ پێنج شەم لەمن**

**هەینیشیان دایەوە بە تۆ**

**بەلاّم هاورێ ئەمجارە شەممە بۆمنەو..**

**تاکیش بۆ تۆ**

**ئەمجارە بڕیار لەمنەو..**

**تەوبە لەتۆ**

**لەتۆ .. لەتۆ.**

**کەرکوك**/2004/11/20







# به ترس موتوربه كرام..!

لە کەناری منداڵیمدا..

خەونم بە ئەستێرە ماسیو..

کۆترە ماسیو.. مرواری نێو دەریای ژیانەوە بینی

لەناکاودا,

شەپۆلێک رایچەڵەکاندمو..

گاگۆڵکەی لەیادی خەونەکانم بردەوە

وردە.. وردە خۆمو.. خەونەکانم گەورە دەبینو..

خەنجەری ترسێکیش لەتمان دەکا

***

قەدەر بوو فێری کردم

بترسمو.. بترسمو.. بترسم

لە گەمە کردن بە خۆڵو..

غاردان لەنێو کۆڵانە چۆڵەکانی سۆزگارێکدا

نەبا دایکم لێمبداو.. جلەکانم بۆ نەشوا





بترسم

لە قسەکردن لەپۆلو..

خەتخەتێن لەگەڵ نیشتمانەکەم

نەبادا.. وانەی جوگرافیام پێ نەڵێنەوە

بترسم

لە پەتپەتێن لەگەڵ خۆمو..

خەوتن لەژێر پەرچەمی, لاپەڕەیەکی مێژوودا

بترسم

لە رشانەوە بە وانەکانی ئاسمانو..

نان خواردن لەسەر خوانی سورەتی ئەنفال

نەبادا مامۆستاکەم, دووپلە لەوانەکانم دابگرێ

بترسم

لە ماڵی باج باجێن لەگەڵ کچی خواوەندو..

چاوشارکێ لەگەڵ سێبەری شەیتاندا

نەبادا,  گەمەکانم لێبسەننەوە

بەر لەوەی عیشق بکەوێتە عوزرەوەو..

پەرۆکەی  لەمەرقەدی هەرزەکاریمدا

بکا بە موتفەرکەو..

بە خۆیدا هەڵیبگرێ

بترسم

لە دڵداری کردن لەسەربانەکانەو..

سەما کردن لەگەڵ ئەو کوڕەی ..

بەجوانترین پەری ئاسمان ناوم دەبا

منیش بە ناسکترین کوڕی جیهان

نەبادا هاوسێکانم بلێن کچێکی (..) .. !؟

بترسم

لە گوێگرتن لەدەنگی خۆمەو..

گۆرانی وتن لە ژورەکەمدا

نەبادا مێژوو چاوی لێم زیت بکاتەوەو..

پێم بڵێ بێ دەنگ بە

بێ دەنگ بە





لەوەتەی هەم بێدەنگم دەکەن

هەموو دەنگەکانیش, لەگوێچکەمدا دەزرینگێنەوە

دەنگی "با"

بەردەوام دێت لە دەرگای ژورەکەم دەداو..

هەواڵی مەرگی فریشتەم بۆ دەهێنێ..

لەکاتی خوێندنەوەی نامەیەک..

لەنێو لەپی پایزێکەو..

خۆحەشاردان لە وشە

حەرامکراوەکاندا

تیرۆر دەکرێن

دەنگی "هەور"

لە کاتی گوزەرکردنی بەکوچەکانی ئاسماندا

بەشێتە تورەی دەکەنو..

دەیدەنە بەر قامچیو جنێوی بروسکەو..

دەیگرییێنن

باڵندە

له كاتی هەڵفڕینیدا.. بەدارلاستیك باڵەكانی دەشكێنن
دەنگی گیزە گیزی مێش‌و مێشوولە..
كەلەسەر تەرمی كچە تیوێكی كوژراودا
خوێن دەمژن
ئەو تەرمەی..
پێش چەند ساتێك
لەپەناگەی من‌و تۆدا گاڵتەی بەهەڵوەرینی..
گەڵاكانی تەمەن دەكرد
لەبەرامبەر ئاوێنەكەی ماڵەوەیدا..
گۆرانی بۆ سبەی دەچڕی
له ژێر لەشی باراندا زاوزێی دەكردو..
كه كوشتیان..
جوانترین بێچوی ژیانی لەبار خۆی برد
قەدەریٚ فێری كردم
بترسم
ئەفسوس له خۆم





چونكە خۆم لەخۆمدا كۆچم كردووەو..
كاسەی عومرم قومێك ئومێدیان تیانەهێشت
بۆ شكاندنی تینویەتی ژین
زۆریش دەترسم
ئەو كاتەی خۆم دەدۆزمەوەو..
دەگەڕێمەوە نێو خودی خۆم
میلی كاتژمێرەكان.. له چركە چرك یاخی بن
بەهارەكان.. توشی تەنگە نەفەسی بن
پایزەكان ( لەمەنفاوە دەگەڕێنەوە مەنفا)
عیسا دووبارە له خاچ بدرێتەوەو..
مەریەم بۆ جارێكی دی بەردباران بكەن
شاعیرەكان شەهید بكەن
وشەكانیان تیرۆر بكرێت‌و..
لەدارە مەیتی دێڕێكدا
بەسەر شان‌و ملی قەسیدەیەكدا
تەرمەكانیان, بەرەو گۆڕستانی ئەو كتێبانە ببەن

کەلەسەر شەقامەکاندا پێیان پیا دەنێن
ئەو کتێبانەی..
لاپەڕەکانیان دەکرێن بە لولەی گوڵەبەڕۆژەو..
فڕێدەدرێن
کەسێک ناچێ بەلایاندا
جگە لەو مندالأنەی..
کۆلارەی لێ دروست دەکەن
ئەو کتێبانە
لەو بێوەژنانە دەچن
مێردەکانیان
لە شەڕی ناوخۆدا
پیاوەتی خۆیان لەدەستدا
ئەمێستا لەسەر ڕەفەی ژنێتیاندا
پیاوێک نیە دەستی سۆزیان بگرێتو..
چاوێک نیە تەماشای جوانیان بکاتو..
زمانێک نیە ناخیان بخوێنێتەوە





جگە لەو حەسرەتانەی
شەوان لەنێو جێگەدا
لاقەیان دەکەن
چەند دەترسم
ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە نێو خودی خۆم
خاک یەخەم بگرێو..
پێم بڵێ:
بەرۆژ ڕێمدای.. لەسەر پشتم ڕێبکەی
تفت لێ کردم
بەشەو لەباوەشم گرتی
کفرت پێ کردم
ڕێگەم پێدای بۆخۆت بژی
جەنگت لەگەڵدا کردم
ئەمێستاکە هەقم دەوێ
تۆ لە خاکیو.. ببەوە بەخاک
کەواتە فریا ناکەومو..

ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە

پاپۆڕی تەمەن دەبێتە خۆراکی دەریا

دەزانن بۆ..؟

چونکە مەرگ

هەموو ساڵێ لە یادی رۆژی لەدایک بوونمدا

بەر لە من فو لە مۆمی تەمەنم دەکا..و

گەمەی , ئانە پانە

لەگەڵ خۆمو خۆم دەکا

ئیدی ترس ئەو نەیارەیە

بەر لەمن خەلق بووەو..

هەر لەو رۆژەی بە رووتی لەدایک بوومو..

مەلۆتکەیەکی سپیان تێئالاندم

تا ئەو رۆژەی بە رووتی دەمرمو..

کفنێکی سپیم لێ دەئاڵێنن

بەدومدا دێت

من دەکوژێتو.. خۆی دەمێنێت

# من و منێکی دی ..!

من هەندێ جار.. کەسێکی گۆشەگیرم
هەندێ جاریش گۆشەکان دەمگرنە خۆ
نادوێمو کەسیش نادوێنم
لەپەنای تاریکیدا..
لەگەڵ وونبوونی شتەکان سەما دەکەم
لە ژورێکی تۆز لێ نیشتوو..
لەسەر جێگەیەکی نارێك پاڵدەکەومو..
لەتەك خەیاڵێکی رووتدا..
مومارەسەی خەمێك لەگەڵ خۆمدا دەکەم
ترپە ترپێك.. لە نێو کەژاوەی جەستەمدا رادەکشێو..
بە ژانەوە.. نەشئەی چرۆی خەونەکانم دەتارێنێ
کاتەکانم زیاتر بەخەو بەرێدەکەمو..
لەپەنجەرەی چرکەکانەوە..
تەماشاکانم بۆ خۆم کوێر دەکەمەوە





کەچی منێکی دی لەخۆمدا.. کە هەر منم
چاوێك دەکا بە هەزار چاو
نەبادا شتێکی جوان لێی تێپەڕبێو..
ئەم نەیبینێ
ئەم ناخەوێ.. تاوەکو خودا نەبینێ
ئەو خودایەی.. لە هەموو شەفەقێکدا..
لەبەر ئاوێنەی سروشتدا.. تەماشایەکی خۆی دەکاو..
بەلەنجەو لار دێتە سەر کانی هەتاو..و
گۆزەی دەستی لە ئاوی حیکمەت پڕ دەکا
منەکەی دی دەنوێو دەمرێ
کەچی منێکی دی لەخۆمدا.. کە هەر منم
وادەزانێ گەر لە خولەکێکدا بنوێ
شەست چرکە جوڵە دەوەستێ
شەست چرکە تەمەن بەفیڕۆ دەداتو..
شەست چرکە روناکی لەبەرچاو وون دەبێ

**ئەو کۆپلەی ئەخیر.. لە وتەیەکی "گابریل گاسیا مارکیز" وەرگیراوە**

## ف..ش..ە..یە !

گریانی بولبولی نێو قەفەسی ماڵەکانو..
قومری لەو دیوی پەنجەرەی ژورەکەمدا
فشەیەکی باڵندەیە
کۆچ کردنی گەڵاکانو..
شیوەنی دار لەدابڕان
لەدیوەخانی وەرزێکدا
فشەیەکی سروشتیە
نامەی گیرفانی کوڕانو..
دەستەسڕە بۆندارە لێو بەسوراوەکەی کچانیش..
فشەیەکی دڵداریە
دەف لێدانو چونە خەڵوەتی دەروێشان
فشەیەکی رۆحانیە
وتنەوەی سرودەکانی نێو کڵێسا
بەدیار پێغەمبەرێکی لەخاچ دراودا





فشەیەکی ئایینیە
حوکم کردنی دوو حاکم
بۆ دادگایی کردنی تەنها زەویەك
فشەیەکی زەردەشتیە
خواردنی سێوی حەرامو..
رووتبونەوەی دایە حەوا
فشەیەکی ئەهریمەنیە
کەوتنە خوارەوەی "یوسف"یش بۆ ناوبیرێك
فشەیەكو..خەیاڵێکە
بۆ جوانکردنی شیعرەکانی خودایە
برایەتیو بانگەشەی پێکەوە ژیان
فشەیەکی سیاسیە
هەموو ئاوازدانەرەکان فشەکەرنو..
وتنەوەی گۆرانیەکانی بوون
فشەیە

نوسینەوەی تەمەنو..

دواتر خوێندەنەوەیان.. فشەیە

ئەو نەگبەتەی بەعیشق..

خۆی لەسێدارەی مەعشوقێك هەڵدەواسیٚ

فشەیە

ریز کردنی ئەم فشانەشم فشەیە

کەواتە من فشەکەرمو..

لای من هەموو شتێك فشەیە

فشە خۆی هەموو شتێکە

2005/1/5

کەرکوك

## لەوەتەی بانگی سەفەری داوە..!

لەو رۆژەوەی.. چووەتە سەر لوتکەی خاڵیی بونەوە لە
عیشق و..
بانگی سەفەری داوە
لەتەقسی حوجرەی خەڵوەتدا.. نوێژەکانم
دابەستیان بیرچۆوە
کامەرانیم.. جادویەکی ژیان بوو
قەدەر بەتاڵی کردەوە
حەزەکانم.. بەدەستی قبلەنومای کۆچەکانیەوە..
هەنگاوەکانیان شکا
پێکەنینم.. هەنسکێ ئیغتسابی کردو..
خەندەم کچێنی خۆی لەدەستدا
ئەو بەردەی گرتیە چارەنوسی خۆی
پەنجەرەی ماڵی مەعریفەم کەوتە بەری و..
شوشەی یەقینمی شکاند





ئەو عیشقەی.. زەمەنێکە دەیپرێسم

بووەوە خوری
ئەو چرکانەی لەسەرە رێی کاتەکان هەڵمگرتنەوە
لە زەنگێکدا بەربونەوە
مۆمی سەر مێزی ژورەکەیشم
پێی وتم لێت خۆش نابم
نەهاتی فرمێسکم بسڕی
تا مەیی بە روخسارمەوە
گەردون ئاوری پێم دایەوە..
نوزە نوزی ئەو تولە سەگەم هاتەوە بن گوێ
کە لە ساڵی پارەکەدا..
لەبەر هەیوانی ژورەکەم لەسەرمادا رەق بووەوە
بۆنی توتن و سیغارەکەی باپیرەم هاتەوە بن لوت
کە بە زەنگی پیربوونی دەپێچایەوە..
بەحەسرەتی گەڕانەوەی لاوێتیدا.. دەیکێشاو..

دوکەڵەکەی بە با دەدا

بوکە شوشەکەی منداڵیم هاتەوە یاد
کەنەمزانی لەگەڵ منداڵانی کۆڵان گەمەی پێبکەم
شیعرەکانم بەسەفەر بە بۆن کەوتن‌و..
بەبینینی پەساپۆرتیش
سۆما لێڵ بوون
دوا شیعریشم
پشتی کۆم بوو
بە بیستنی وشەی دەرۆم
پێڵاوەکەی لەپیٚ کردو..
بە گۆپاڵێکی دار بەڕو..
گەڕایەوە بۆلای یەکەمین شیعری ئەم دیوانە
کە دەیوت:
"لەحزوری گومانتدا.. زریکە لە ئەوینم هات "
منیش وتم: ئەمێستاکە لەحزوری سەفەریدا..
زریکە لە ئەوینم دیٚ





دووەمین وتی:

من"بەر لەوەی سنور بشکێنم.. درزم تێکەوت"
منیش وتم:
ئەمێستاکە درز کەوتووەتە رۆحی من..
گەر بزانم یارم سنور دەشکێنیٚ
سێیەمین وتی: "تەنیایی لەمن هەڵدەکا"
منیش وتم: گەر رۆژانە بەیانی باشی نەبیستم
بۆنی غەریبی دەگرم‌و..
لەگەردەلولی نامۆییدا هەڵدەکەم
چوارەم وتی: "من‌و تۆو ..؟"
دوو خاڵ بەرِووی لاپەرِەکەمدا ئەڵقاوێز کراین
منیش وتم: ئەی من‌و کیٚ..؟
ئەگەر ئەو وکۆچ‌و جانتا بوون بە هاورِیٚ
پێنجەم وتی: "بەرسیلە عیشقیٚ بۆ خودا" دەنێرم
من وتم: با خودا لەپاش کۆچی ئەو
فەریکە سەبوریەکەم بۆ بنێریٚ

شەشەم وتی:

"بەکام ئاسمان ئارەزوی فڕینت کردم..؟"

پێیم وت: ئەدی کام نەهامەتی ئارەزوی گریانم دەکا..

تا جامێك پڕ بکەم لە ئەشكو..

بەدوی هەنگاوەکانی ئەودا بیرێژم

بەڵکو بە سەلامەتی بگەڕێتەوە

یەکێ دی وتی: "واقیعم بە خەیاڵ چنراوە"و

شایەتمانم پێ هێناوە

منیش وتم: ئەدی من چی بکەم.. کە خاکی دڵم بەتەمو

تەوژمی..

بۆمبی کۆچی یار چێنرابێ..؟

شیعرێکی دیکە وتی:

وەرە با"حەیرانێك بۆ برینەکانی خاك " بچڕین

پێیم وت: ئەو بەر لەمن پەردەی لەسەر برینەکانی

خاك هەڵدایەوە

زامێکی پێ هەتوان نەکرا.. بۆیە نیشتمان بەجێ دەهێڵێ





ئەوەی دی وتی:

با" کۆچێك لە هەستو.. هەستێك لە ئەندێشە " بکەین

پێیم وت: کۆچێك لەسەر ڕێی ئەودابێو..

قەرارێك لەناخی ون بونیەوە هەڵقوڵابێ..

چ لە پیاسەی قەدەر بکەم..؟

شیعرێکی دیکە کە گوێی لە وشەی قەدەر بوو

پێی وتم: "قەدەر.. بوخچەی مەرگی پێ هەڵگرتی"..؟

پێیم وت: قەدەرگەلێك منی لەبوخچەی مەنفا

پێچاوەتەوەو..

بەپشتی جیهانێکی نابەڵەد.. باری بوونم پێ دەکا

یەکێ تر وتی: "پارچەکانی نازو نەفرەت لەگەڵ یاردا"

چی بەسەر هات..؟

پێیم وت: پارچەیەکیان لە گیانمدا چەقیوەو..

پارچەکانی دیکەش کەوتنە دیکۆمینتی یادگاریەوە

لەپاش دەمەتەقێی نێوان شیعرو..

قیژە قیژی هەناسەی من

**شیعرێکی چاو بەخەو پێی وتم: "بۆ بێ دەنگی..؟"**

**کوا بێ دەنگم..؟**

**ئەوە بێ دەنگی پەساپۆرتی گیرفانی یارەکەمە**

**بێ ئەوەی شەرمم لێ بکا..**

**لەسەر سینگی راکشاوەو..**

**چاوەڕوانی وشەیەکە گەمەی لەگەڵدا بکاتو..**

**(کۆچ)یش بکا بەشوناسی خۆشەویستم**

**شیعرێ دی وتی:**

**لە ئێستاوە" تەوبەیەو.. بڕیاریش دەدەم"**

**لە دوریانی هاتو نەهات**

**تەوبەی چیو.. بڕیار لەچی..؟**

**خۆ من سەدان جار تەوبەم کردو.. گەڕامەوە**

**سەدان جاریش بڕیاری فیراقم دا.. پەشیمانی**

**شەپازللەیەکی لێدامو.. لەخەو رایچەڵەکاندم**

**یەکێ دی وتی:**

**بەم قسانەتان " بەترس موتوربە کرام..!"**

**ئەدی من هەرچەند دەکەم ناوێرم بیهێنمە بیری خۆم**





**یارم کۆچ دەکا**

**ئەوەی دی وتی: "منو منێکی تر..!"دەکاتە خۆم**

**پێیم وت: من + ئەو = عیشق + سەفەر = فیراق**

**دوا شیعر وتی: ئەی خۆت نەتوت هەموشتێك**

**"فشەیە"..؟**

**فشەیە..؟**

**فشەیە..؟**

**سەد خۆزگە رۆیشتنی ئەزیزی من فشە دەبوو..**

**هەنگاوەکانی دەگەڕانەوە..**

**پەساپۆرتەکەی دەسوتاند..**

**سەد خۆزگە**

**شەمەندەفەرو.. شۆفێرەکان**

**کەشتی نوحو.. باڵدارە ئاسنەکان..**

**مۆڵەتی لێخوڕینی ژیانیان ون دەکرد**

**تاکو یار ئاوڕێکی لە ئەوینو سۆزم دەدایەوە**

**پەیمانم دەدا..**

**پەناهەندەی خۆشەویستی تا مەرگمی پێ بدەم**

2005/8/22

# پێڕست